

# مەم و زین

## بەهەورامی



ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوە

نامق هەورامی

2020

* **ناوی کتێب** : مەم و زین بەهەورامی
* **بابەت** : لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری
* **نووسەر و لێکۆڵەر** : نامق هەورامی
* **بەرگ** : ئارش عەباسی
* **دیـزاینی ناوەوە** : شاخەوان جەعفەر
* **تایـپ** : نووسەر
* **ساڵی چاپ** : ٢٠٢٠
* **چــاپ** : چاپی یەکەم
* **تـیـراژ** : ٥٠٠ دانە
* **نرخ** : ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (١٨٠) ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە

لەسەر ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەری هەڵەبجە چاپکراوە

ئی لاقۆره گولانێ پێشکەشەنە

• بە ویەردەی رۆشن و پەڕ جە ئاوەزو هەورامانی، پەی ئیسەی رۆشنایێ گۆرەن کە میاونۆما بە ئایندێوی گەشتەر و پەڕ جە ئاوەز..

• بە گیانو ئانیشا چی رێنە چراوێوەشا گیسنێنەنە و نمازا ئی فەرهەنگە ئۆجاغ کۆر بۆنە..

# پێشـــەكی

هەمیشــە نــاو دڵی چیاكانــی زاگرۆس مەڵبەندی ئافراندن و جوانخاســی بــوون، لەم بومەدا زۆر شــت دەركەوتون، بەداخــەوە یان لەناو چون یان بەناوی خەڵک و نەتەوەی ترەوە لە مێژودا تۆمار كران.

وردە وردە شتی دەگمەن و دانسقە دەدۆزرێنەوە، بۆیە پێویستە شەرم لەوە نەكەین و بوێرانە باسی ئەوە بكەین جارێكی تر مێژوو بخوێنرێتەوە و دابڕێژرێتەوە.

پێشــتر كاتێک ناوی مەم و زین دەهات تەنها بیرمان بۆ شــاعیری مەزن خانی دەچوو، پێمان وابوو ئەو یەكەم و دوا خاوەنی ئەم داستانەیە.

ئیســە دوای دەركەوتنــی دەســخەتی تــر و هاوشــێوەی ئەم داســتانە و كتێبــی تــر لە شــوێنەكانی تری كوردســتان، دەبێــت دەرگای لێكۆڵینەوەی زیاتر بكرێتەوە بۆ قسەو باس.

ئەمــە لەكاتێكدا توێژەر باوەڕی نەگۆڕی بــەوە هەیە، دەركەوتنی دەیان شــێوە داســتانی تر بە هەمان ناوەوە لە گەورەیی و داهێنای ئەم شــاعیرە مەزنەمان كەم ناكاتەوە، بگرە ئەم گەورەتر دەبێت.

خۆمان لەهەموو كەس شــیاوترین قســە لەســەر شــاكارە ئەدەبییەكانی خۆمان بكەین و خەسارناســی و بەها و ئاكســیۆلۆژیای دەقەكان دیاری بكەین.

ئــەم هەوڵــەی مــن هەنگاوێكــە لــەو بارەیــەوە، زیاتر خۆمان بناســین و رەگەكانی نزیكبونەوەی شێوەزمانەكانی كوردی بەهێزتر بكەین، بەتایبەت لەنێــوان هەورامــی و كرمانجیــدا، چون ئەمە گرنگــە ، لەجوگرافیای نێوان ئەم دوو شێوەزمانەدا كوردی ناوەڕاست هەیە، گرنگە ئەو رێگەی بەیەک

گەشتنانە بدۆزینەوە.

ئەمــەی من کردومە تەنها ناســاندنی دەقــە هەورامییەکانە و هەوڵم داوە لەیــەک چــوەکان و جیاوازییەکانــی لەگەڵ دەقە کرمانجیی و ســۆرانییەکە بخەمە بەرچاو.

بابەتەکــە بۆ هەمــوان جێگەی تێرامــان و لێوردبوونەوەیە، لەکوێوە ئەم داســتانە گەشــتە هەورامان؟ ئایا تاچەند ئەم داســتانە بەگرنگ زانراوە کە وەربگێڕدرێت یان لەوێ بنوســرێتەوە، گرنگیی دەقەکەیە یان توانایی ئەو زمانەیە کە پێی نوسراوەتەوە؟

ناکرێــت ئەدەبــی زارەکــی و پێگــەی زمانــی هەورامــی نادیــدە بگیرێــت، هەورامییەکان لە کۆنترین نەتەوەکانن، لە چەرخی گەشەی شارستانیەتی خۆیان قۆناغگەلێکی جۆراوجۆریان تێپەڕاندووە و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی زۆریــان ئەزمــوون کردووە، بەو پێیــەی ئەدەبیاتی زارەکی هەر گەلێک لە ئەدەبیاتــی نووســینەکیەکەی کۆنتــرە، کەوایە ئاســاییە ئەدەبیاتی زارەکی هەورامیش لە ئەدەبیاتی نووسینەکەی کۆنتر بێت.

لــە چاوپێخشــاندنێکدا دەتوانیــن هۆنــراوە زارەکــی و فۆلکلۆرییــە هەورامییەکان دابەش بکەین بۆ دوو جۆر:

- داستانی
- غەیری داستانی

هۆنراوەکانــی کۆمەڵــەی یەکــەم کــە ژمارەیــان زیاتــرە لــە جۆرەکانــی دیکــە، بەپێی ڕووداوەکانی مێژووی ناوچەکە، شــەڕوناکۆکی نەتەوەیی و ئایینیەکان، هەڵگیرسانی شەڕ ، هەروەها چیرۆکە ئەوینییە بێ ئاکامەکان و دڵداریــە سەرکێشــییەکان نووســراون و بــە شــێوەیەکی گشــتی پێیــان دەوترێت بەیت.

ئەگـەر سـەرەنجی دێڕەکانـی هۆنـراوەی مـەم و زیـن بـە هەورامـی بدەیـن، دەگەینـە ئەو ڕاسـتیەی کە شـاعیری هەورامی زمـان لە زۆربەی چیرۆکەکـەدا تاڕادەیـەک لایەنـی گشـتی پاراسـتووە و داسـتانەکەی بـە مێشکە داهێنەرانەکەی خۆی دایڕشتۆتەوە، ئەمەش ناکرێ نادیدە بگیرێت لـە توانایـی هێزی ئەو زمانـە، کەوابوو، هەر نوسـینێک دەرخەری توانای زمـان و شـوناس و دواتـر جەدەلـی نێـوان زمان و شوناسـە کـە دەبێتە هۆکاری بەرهەمهێنانی کاری جوان و ناوازە.

ئەم جۆرە گێڕانەوانە داگری ئەو چیرۆکانەن کە هەڵگری واتاو ناوەڕۆکی ئوستووریی و حەماسین و لە گێڕانەوەکانی خۆیاندا ئاماژە بە زەمەنێکی نادیار دەکەن.

ئوسـتوورە، نهێنییەکانی پێشـینانی ئێمـەن، ئەو نهێنییانـەی نەیانتوانیوە بەڕاشکاوی دەریبڕن. هەر ئەو نهێنییانە بوونەتە زمانی هێمایی بۆ دێو و درنج و بابەتی لەم چەشنە.

دنیای ئوستوورە پڕە لە ڕاستی. پڕە لە ئاوات و ئارەزوو و حەز. میرچا ئەلیادە دەڵێ: « ئوستوورە مێژوویەکی پیرۆز دەگێڕێتەوە.»

ئێسـکیمۆییەکان بۆ سـەلماندنی مێـژووی پیرۆز و نەریتـە ئایینییەکانی خۆیان دەڵێن: « ئاوایە، چونکە گوتراوە کە ئاوایە.».

ئوستوورەی خوداوەندی شەهید، یەکێکە لە ئوستوورە دیارەکانی گەلانی زاگرۆس و نێوان دوو ڕوبارە، ئوستوورەیەک کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگـەڵ شـێوەی ژیانـی خەڵکـی ناوچەکە هەیـەو گرنگترین ئوسـتوورەی ژیانـی هێتیارییـە. ئەم ئوسـتوورە لەگـەڵ هێتیاری و چانـدن و دروێنەوە پەیوەندی هەیە، ئوسـتوورەی ئیزەدی شـەهیدکراو، ئوسـتوورەی ژیانی هێتیاریـەو ئـاوات و ئامانجـی هەمیشـەی هێتیار هـاوڕێ بوونی زەوی و وەرزەکان لە گەڵ ئەو و باشبوونی بەروبوومەکەیەتی. بۆیە ڕێوڕەسمێک

لـە ژێر سـێبەری ئوسـتوورەیەکدا بەڕێوەدەبـا، بۆ ئـەوەی (ژن-خودا)ی زەوی لێخۆشبێت و کشتوکاڵێکی بە پیتی بداتێ. واتە دواهەمین بەشی چیرۆکەکـە ئـەو چاوەڕوانییـەو ئەو ئومیدە نیشـان دەدات کە ئینسـان بە هۆی ئەوەوە ئوستوورەکەی خوڵقاندوە.

کۆن ترین بیچمی ئەم ئوسـتورەیە ئوستوورەیەکی مێزۆپۆتامیاییە، لەم ئوسـتوورەیەدا (ئینانـا) (ژن-خودا)وەندێکە کە عاشـق بە کوڕە شـوانێک دەبێـت بە نـاوی (دوومـوزی)، (دووموزی) مل بەو خۆشەویسـتییە ناداتو (ئینانـا) بە تۆڵەی ئـەو نافەرمانییە کارێک دەکات دوموزی بکەوێتە دنیای ژێرزەوی یان دۆزەخ.

نموونەی هەرە بەرچاوی شـینگێڕی بۆ ئیزەدی گیایی، شینی سیاوەشە کـە لـە ئێرانـی پێش لە ئیسـلامدا بەڕێوە دەچوو لە هێندێ شـوێن وەکوو شـیراز تەنانەت تا سـەدەی بیسـتەمیش مابوو. ئەو ڕێوڕەسـمە ئەوەندە بەهێز بوو کە پاش زاڵ بوونی ئیسلامیش توانی خۆی رابگرێتو لە ڕێگای گۆڕانی ناوی پاڵەوانەکانەوە بە ژیانی خۆی درێژە بدات. شینی سیاوەش بە زۆربەی تایبەتمەندیەکانیەوەو زۆرینەی سەمبولەکانیەوە لە ژێر ناوی عاشـوورای حوسێنیدا دیسان بەهەمان هێزی پێشوویەوە سەری هەڵێناو ئێستاکەش هەر ساڵ لە ناو شیعەکاندا بە تینێکی تایبەتەوە بەڕێوە دەچێت. لێوردبوونـەوە لـە سـەر ئـالآو بەیداخەکانی ڕۆژی عاشـوورا کـە پڕن لە نیشانەکانی ڕێورەسمێکی وەرزێری( وەکوو درەختی سەرو، گیاو باڵندەو هتد) سـەلمێنەری ئەو راسـتیەیە کە عاشـوورای حوسـێنی درێژەدراوی شینی سیاوەشەو یەکبونی و یەکسانی ئەم دوو ئایینە دەخاتە بەرچاو.

شـینی سـیاوەش و شـینی مـەم، دوو ڕێورەسـمی هاوتەریبـو دوو گێڕانەوەی یەک دابن.

لە داسـتانی مەموزیندا ئەو بەشـە گۆڕاوە بەڵام هەر لەو مووتیڤە دەیان

چیرۆکی سەربەخۆو جوراوجۆر سەری هەڵێناوە تا رادەیەک کە رەوتی خۆشەویستی نێوان شوانو کچە ئەمیر یان کچەخان بووە بە ناوەڕۆکی بەشێکی زۆر لە بەیتو چیرۆکە کوردییەکان بۆ هەموان ناسراوو ئاشنایە.

ئەم شینگێڕییە پێی دەوترێت چەمەری، چەمەری شێوازێکی مۆسیقای شین گێڕیە کە لە ناوچەکانی سەر بە زاگرۆس دا وەک لۆرستان و ئیلام و کرماشان ئێستاش هەر باوە و بۆ لە دەست دانی ئازیزان بە دەهۆڵ ۆ زوڕنا لێدەدرێ ..

لە هەوراماندا هەمان مەراسیمی چەمەری هەیە و پێی دەوترێت کۆتەڵ ، لەکاتی مردنی کەسێکی ناوداردا ئەم مەراسیمە سازکراوە، رێپێوانێکی هونەریانەی سەیرە، بەشداران لە کۆتەڵدا دەبنە چەند ریزێک، ئەوانەی دەکەونە پێشەوە ئەوانەن کە جلی رەشیان لەبەردایە یان پەڕۆی رەشیان کردوەتە ملیان، لەناوەڕاستدا داهۆڵی مردوەکە دروستکراوەو جلەکانی کراونەتە بەر داهۆڵەکە لەگەڵ بەشێک لە کەلوپەلەکانی وەک تفەنق و کولەباڵ و تەسبیحەکانی و سواری ئەسپەکە کراوە، ریزی تفەنگچییەکانی کەسە ناودارەکە ئەملاو ئەولای ئەسپەکەیان گرتووە، کاروانی کۆتەڵچییەکان قوڕیان گرتووەتە سەریان، یا سەرشانەکانیان قوڕاوی کردووە، ئەوانەی تفەنگیان هەبووە لولەی تفەنگەکانیان بەرەو خوارەوە بووە.

**هەولێر**

**٢٠/٢/٢٠٢٠**

## ئەم توێژینەوە بۆ؟

بەمەبەستی زیاتر تێگەشتن لەوەی ئایا مەم و زین چۆن گەشتوەتە هەورامان و شێوازەکانی ئەو سنوور بڕینە چۆن دروست بوون، ریشەکانی ئەم داستانە لەکوێدان و چۆن لەگەڵ ئوستورە زاگرۆسییەکاندا یەک دەگرێتەوە.

لەم سۆنگەیەوە هەوڵمانداوە کۆمەڵێک پرسیاری جدی بوروژێنین و زۆر دەلاقەی دیکە بکەینەوە، قسەکردن لەسەر زۆر بابەتی جدی، لەوانەش چیرۆکی خواوەندی شەهید کە کەمتر زانیاری لەسەری هەیە و کەمترین باسی لێکراوە.

بوونی چەند نموونەیەکی تر لە مە و زین لەناوچە جیاوازەکاندا، ئەمە بۆخۆی گفتووگۆیەکی گرنگ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەتایبەت بوونی سێ بەیتی مەموو زین لەناو ئێزیدییەکاندا، جگە لەو بەیتەی موکریان کە ئۆسکارمان لەسەر زاری رەحمان بەکر کۆی کردوەتەوە، مەموزینێکی دیکە هەیە بەناوی مەموزینی رەواندز.

ئەمە سەرباری دوو نوسخەی دەستنووسی ئەم داستانە بە زمانی هەورامی، یەکەمیان لای بەڕێز کەیومەرسی نیک رەفتار کە ساڵی ٢٠١٣ لەکتێبێکدا بەناوی کەشکۆڵ لەگەڵ چەند داستانێکی تردا ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد لە سلێمانی چاپی کردووە، داستانێکی تر هەیەبەهەمان شێوە و لەنێو مۆزەخانەی دەستنووسەکانی بەرلین دۆزراوەتەوە و هەندێک لەسۆشیال میدیادا وەک داستانی مەمی ئالان بە هەورامی ناساندوویانە.

بابەتێکی گرنگ کە لەم کتێبەدا ئاوڕی لێدراوەتەوە قسەکردنە لە زمان و شوناس و جەدەلی زمان و شوناس، ئەمە جگە لە بەراورد

و دۆزینەوەی خاڵە جیاوازەکانی دەقەکەی خانی و دەقەکانی ئەم داستانە لەناو ئێزیدیاندا، هەروەها جیاوازی دەقەکەی رەحمان بەکر و مەم و زینی خانی، دواجار بەراوردی دەقە هەورامییەکە لەگەڵ ئەوەی خانیدا.

## گرنگی توێژینەوەکە

گرنگی توێژینەوەکە لەوەدایە توێژەر هەوڵی داوە ئەوەی لەبەردەستا هەیە سەبارەت بەم داستانە بخرێتە بەردەم خوێنەر، چونکە ناسینی ئەم داستانە پێویستی بە ریشەناسی خودی داستانەکە هەیە، ئەمە سەرباری ئەوەی بەداخەوە کەمتری توێژەران شارەزای زمانی هەورامین و کەمترین ئاوڕیشی لێدراوەتەوە لە ناوەندە ئەکادیمییەکاندا، بۆیە لای زۆرێک لەشارەزایانی بوارەکە شتێکی نامۆ بوو.

گرنگی ئەم بابەتە بەلای توێژەوەوە لەوەدایە دەروازەیەکی نوێ بەڕوی مەم و زیندا دەکاتەوە و پرسیاری نوێ دەوروژێنێت، لەتاک جەمسەری ئەم داستانەوە بۆ فرە جەمسەری و بەربڵاوییەکمان دەبات، ئەمە سەرباری ئەوەی هاوکات لەگەڵ رێنوسی نوێی داستانەکە بەهەورامی، لاپەڕەی دەستنوسەکانیش بڵاودەکرێنەوە و بەمەش دەستنوسەکەش لەفەوتان دەپارێزرێت.

## گرفتی توێژینەوە

هـەر کارێکـی زانسـتی بۆخـۆی کێشـەو گرفتـی دێتـە پێـش، لـەم کارەدا وەک مامۆسـتا کەیومـەرس دەڵێت: «نەمانـی چەنـد لاپەڕەیەکـی یەکـەم و کۆتایی گرفتـی سـەرەکی بـوون، چونکـە لـە دەسـتنووسـەکاندا لـە سـەرەتاو کۆتاییـدا بەپێـی لێکدانـەوەی پیتـەکان یـان بەنووسـینی راسـتەوخۆ سـاڵی نووسـین و نـاوی نووسـەر دەنوسـرێت و نەبوونـی ئـەم لاپەڕانـە ئـەم کێشـەیە دروسـت دەکات»، بـەڵام لـەوەی دووەمـدا ئـەم کێشـەیەمان نابێـت

کاتێـک سـەرقاڵی کارکـردن بـووم لـەم دوو دەسـتنووسـە،مەم و زیـن بەهەورامـی و شـێخی سـەنعان بـە هەورامـی، لەدهـۆک کۆڕێکـم سـازدا، زیاتـر بەهەورامـی لەبـارەی بابەتەکـەوە دوام، دوای کۆڕەکـە بەڕێزێـک هەسـتایەوە گوتـی ئەمـە ئەسـڵی نییـەو قسـەیەکی زارەکـی سـەر زمانـی خەڵکـە، کاتـێ لێـم پرسـی ئایـا هیچـی لـێ تێگەشـتی؟ گوتـی نـا، بـەڵام ئـەو دوو داسـتانەی تۆ باسـیان دەکەیت جگـە لـە خانـی و فەقـێ تەیران کـەس خاوەنیـان نییـە!!!!

گرفتـی کەمـی سـەرچاوە بـە هەورامـی لەسـەر ئـەم بابەتـە وایکـرد پەنـا بـۆ داسـتانە هـاو ناوەکانـی مـەم و زیـن ببـەم لـە ناوچەکانـی دیکـەی کوردسـتاندا تـا بەسـەرەداوێک بگـەم لـەوەی مـەم و زیـن ئایـا بـە هەورامـی نووسـراوەتەوە یـان وەرگێڕدراوە؟ کێـن ئەوانـەی لەهەوراماندا شـارەزایی شـێوەزاری کرمانجـی سـەروون؟ بۆئەمـە دیسـان دەبێـت بگەڕێینـەوە بـۆ خەزێنـەی پـڕ لـە زانیـاری نێـو دەفتەرەکانـی یارسـان تـا ئاسـانکاریمان بـۆ بـکات، چوونکـە لـە قۆناغـی درەوشـانەوەو گەشـەی ئـەم ئاینـەدا دەیـان کـەس لـە سـنوورەکانی کرمانجـی سـەرووەوە هاتنـە

هەورامـان و بونەتـە سەرسـپەردەی شـای هەورامـان، ئەمـە خاڵێکـی گرنگـە بەوەمـان بگەیەنێـت کـە گریمانـی ئـەوە بکرێـت ئـەم بەڕێزانـە ئـەو شـاکارەیان گەیاندبێتـە هەورامـان و لـەوێ وەرگێڕدرابێـت یـان داڕێژرابێتەوە،بـۆ زیاتـر زانیـاری کتێبـی ( پەیڕەوکارانـی یارسـان لەکرمانجـی سـەرودا، نوسـینی نامـق هەورامـی.

## مەم و زین

ئـەوەی تـا ئێسـتا زانـراوەو بیسـتراوە مـەم و زیـن شـاکاری شـاعیری گـەورە ئەحمـەدی خانییـە، ١٦٥٠ بـۆ ١٧٠٨، خانـی ئـەم داسـتانەی بـە مەمـی ئالانیـش ناسـراوە.[1]

مـەم و زیـن چیرۆکێکـی دڵدارانـەی راسـتەقینەیە کـە دوو سـەد سـاڵ پێش ئەحمەدی خانی لـە ناوچەی جزیری بۆتـان ی کوردستانی تورکیە روویـداوە [2] و دەنگبێـژان ئـەو چیرۆکەیـان لـە قالبـی ئـاواز و حەیـران گوتـووە و سـینگ بـە سـینگ پاراسـتویانە تـا گەیشـتۆتە سـەردەمی خانـی و ئەویش لـە سـاڵی١٦٩٢ لەسـەر بنەمـای چیرۆکێکـی ڕاسـتیدا بـە شـێوەزاری کرمانجـی کردوویەتـی بـە مەسـنەوییەکی بەنـرخ و درێـژ. خانـی روداوەکانـی نـاو داسـتانەکەی سـەر لەنوێ بەزیاتـر لـە (٢٥٥٠) دێر هۆنـراوە دارشـتەوە. مـەم و زینـی ئەحمـەدی خانـی یەکێـک لـە بەرهەمـە گرینگەکانـی وێـژەی کلاسـیکی زمانـی کوردییـە، دەسـپێکردنی یەکـەم

١ – ئەحمـەدی خانیـی نەمـر، سـادق بەهادیـن ئامێـدی، گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد، ژمـارە ٢، بەشـی یەکـەم، بەغـدا ١٩٧٤، ل ٧٦٩

٢ – اسـماعیل شـمس، فولکلـور و تاریـخ کـرد، نشـر: مجمـع ذخائـر اسـلامی، ٢٠١٥ ایران-قم، ص١٧٤

رووداوی داستانەکە بە نەورۆز و ئەو وەسفانەی خانی بۆ نەورۆزی کردووە کاریگەری گەورەیە، خانی دەیەوێ وەک ئەوەی مەم و زین بۆ خەڵک بژێنێتەوە خەڵکی بە نەمر سەیری داستانەکەی بکەن، ئاوا نەورۆز و دابی نەورۆز بۆ خەڵکی تۆمار بکات و بەنەوەکانی دوای خۆی بڵێ باوانی ئێوە بەم شێوەیە نەورۆزیان دەکرد[1].

## پوختەی چیرۆک

زینەدین، میری بۆتان، دوو خوشکی هەیە بە ناوەکانی «زین» و (ستی) (Sitî) کە لە جوانیدا بەناوبانگن. (تاجدین) یەکێک لە پیاوانی ژێردەستی میرە کە زۆر لایدا خۆشەویستە. تاجدین برادەرێکی هەیە کە لە برا نزیکترە پێی و ناوی (مەم)ە. ئێوارەیەکی نەورۆز کە هەموو خەڵکی گوندەکە لە دەرن و خەریکی جەژن و گۆڤەندن مەم و تاجدین جلی کچانە لەبەر دەکەن.

تاجدین و مەم دەیانەوێ پێکەوە بڕۆنە داوای ستی و زین، بەڵام پێیان دەڵێن کە بەیەک جار دوو کچیماڵێ بە شوو نادرێن. مەم و تاجدین بڕیار دەدەن کە سەرەتا تاجدین بڕواتە خوازبێنیی و پاشان مەم. میری بۆتان لە خوازبێنیی تاجدین خۆشحاڵ دەبێ و ستی و تاجدین زەماوەند دەکەن.

دوای دەمێک ڕۆژێک میر دەچێ بۆ ڕاو و بە هەموو خەڵکی گوندەکە

---

٣ - سەنگەر قادر شێخ محەمەد، بنیاتی گێڕانەوە لە داستانی ( مەم و زین) ی ئەحمەدی خانی و ڕۆمانی ( شاری مۆسیقارە سپییەکان) ی بەختیار عەلیدا ، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی لە دهۆک ٢٠٠٩، لا ١٦٣

دەڵێ لەگەڵیدا بێنە دەرەوە. مەم و زینیش کە ماوەیەکە لە یەک دوور کەوتوون و لە عیشقی یەکدا دەسووتێن، لە باخی میردا یەکتر دەبینن. ئێوارە کە میر و ڕاوکەران دێنەوە، بەسەریاندا دێن، کە بە هێژایی تاجدینەوە، میر ئاگادار نابێ. بەڵام پاش ماوەیەک «بەکۆ» (بەکر) وەزیری زاڵم و دڵپیسی میر، ڕازەکە لای میر ئاشکرا دەکات.

ماوەیەک مەم لە گرتووخانە دەبێ. تاجدین و براکانی بۆ شفاعەت دەچن بۆ لای میر.

بەڵام پێش ئەوەی هەواڵی بەخشینی میر بگات بە مەم، بەکۆ ژاراوی پێدەدات. کاتێک زین هەواڵەکە دێنێت بۆ مەم، مەم گیانی تیا نەماوە.

مەم ئەوەندە نامێنێت و لە ئامێزی زیندا دەمرێ. زین بەزەیی بە بەکۆدا دێ و ئازادی دەکات. زین لە شینی مەمدا خۆی دەکوژێ و تاجدینیش بەکۆ دەکوژێ. مەم و زین لەپاڵ یەکدا و بەکۆش لە خواری ئەواندا دەنێژن.

## ڕوخساری مەم و زین

• ئەحمەدی خانی زۆرینەی مەم و زینی بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو شێوەزاری بۆتانی نووسیوە گەر چی هەوڵی ئەوەی داوە شێوەزاری تری زمانی کوردی بەکاربهێنێت

• خانی لە مەم و زیندا کێشی عەرووزی عەرەبی بەکارهێناوە

• جگە لە کوردی گەلێ وشەی بیانی لەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی بەکارهێناوە.

• خانی لە یەکیەتی هۆنراوەوە لایداوە و هاتۆتە سەر قافیەی دێری مەسنەوێ یاخود جووت سەروا، کە پێشتر لە داستانە فارسیەکاندا بەکارهاتوە.

## خانی لەمەم و زیندا

- لەسەرەتادا بە ستایشی خودا و پێغەمبەر دەستی پێکردووە
- خانی لە مەم و زیندا خۆی وەک فەیلەسووفێکدا دەنووێنێت ئەویش بە شیکردنەوەو جیاوزی کردنی لە فەلسەفەی ئیسلامی و یۆنانی
- خانی لە مەم و زیندا هانی کوردی داوە بۆ بەرەنگاربوونەوە دژ بە داگیرکەران
- خانی مەم و زینی کردۆتە دوو عاشقی خواناس، وای داناوە ئەوان گەیشتوونە پلەی فەنا بوون.
- خانی ویستی بووە کە بیرو رای خۆی دەرببڕێت

وەکو چۆن دەڵێت: **شەرحا غەمێ دل بکەم فەسانە**
**زین و مەمێ بکەم بەهانە.**

ئەو بەرهەمە یەکەم جار بەکوردی ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەمبول لە چاپ دراوە و بە زۆربەی زمانە زیندووکانی دنیا وەکووئینگلیزی،فەرەنسی، رووسی، ئەڵمانی و عەرەبی و زۆر زمانی تر وەرگێڕدراوە، مامۆستا هەژاریش کردویەتی بە کوردی ناوەڕاست، بەڵام پێش هەژار ، دەقی مەم و زین سەرەتا لەلایەن مامۆستا عوبەیدوڵڵای ئەیوبیانەوە لە لاتینییەوە وەرگێڕدراوە بۆ کوردی موکریانی،لە بڵاڤۆکی زانکۆی ئەدەبیاتی تەورێز ساڵی ١٣٤٠- ١٣٤١ هەتاوی بەچاپ گەشت.[١] لەو دەمەدا کە خانی مەم و زینی نوسییەوە نووسین بەکوردی کەم بوو، لەو سەر و بەندەدا فارسی

---

١- قادر فەتاحی قازی، سێ بەیتی فۆلکلۆریک» مەم و زین، خەج و سیامەند، ئەحمەدی شەنگ»، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس -ژمارە ٩١٣، هەولێر ٢٠٠٩، ل ٧

نەک وەک زمانی هەرە دەوڵەمەند بۆ دەربڕینی ئەدەبی دادەندرا، چونکە زۆر خەڵکی خوێندەوار لە ئیمپراتۆری عوسمانی دا دەیانتوانی ئەو زمانە بخوێننەوە، هەر وەها لە هیندووستان و ئێرانیش. ئەحمەدی خانی دەبێ زانیبێتی کە بڕیار دانی بۆ بە کوردی نووسین لە جیاتی فارسی بەو مانایە دەبێت قەت خوێنەرو وبیسەری ئەوەندەزۆرنابێ و خوێنەرەوەکانی هەر کوردەکان دەبن ، خانی بە زانایی زمانی کوردی هەڵبژارد بۆ ئەوەی پلەی کولتووری کوردی لە چاوی دراوسێیەکانی کوردەکاندا بەرەو ژوور بەرێ، بە قسەی خۆی:

دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد
بێ مەعریفەتن، بێ ئەسڵ و بنیاد
ئەنواعی میلەل خودان کتێبن
کورمانج تەنێ د بێ حەسێبن

شاعیر و رۆشنبیری گەورەی کورد خانی ناوی ئەحمەد بووە، کوری ئەلیاس کوڕی رۆستەم نازناوی شیعری لە هۆزی خانیان وەرگرتووە، بەشێکی ئەم هۆزە لە دەوروبەری ناوچەی بۆتان بوون، بەڵام بنەماڵەی شاعیر باریان کردووە بۆ شاری بایەزیدبایەزید.

ئەحمەدی خانی لە ساڵی ١٦٥٠ لە شاری بایەزید لە دایک بووە، وەک لە سەرچاوەکانی ژیانی و کردەوە ئەدەبییەکانی شاعیر دەردەکەوێ باب و باپیرانی لە رووی داراییەوە ژیانیان ئاسان بووە و بە بەختیاری ژیاون.[1] ئەحمەدی خانی هەموو ژیانی بۆ خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و هۆشیاریی سیاسی خەرج کردووە لە

١- دور العلماء الكورد في الدولة العثمانية القرنان السادس عشر و السابع عشر، نازدار جليل مصطفى ، من مطبوعات الاكاديمية الكوردية ، مطبعة الحج هاشم، اربيل ٢٠١٢، ص ٣٨

کۆمەڵـی کوردەواریـدا. ئەمـە دوو لایەنـی رووناکـی بـووە، یەکەمیـان بەرهـەم هێنانی داهێنانی ئەدەبی، واتـە شیعری، دووەمیـان فێرکـردن و پێگەیاندنی منداڵان و لاوی کـورد لـە رووی خوێندەوارییەوە.شـاعیر لـە مەڵبەنـدی لـە دایکبوونـی، شـاری بایەزیـد، لەسـاڵی ١٧٠٧ کۆچـی دوایـی کـردووە و هـەر لەوێـش نێـژراوە، ئـەو زانیارییانـەی لـە نـاوەوەن ئـەم مێژووە راسـت دەزانـن، جگـە لەمـە بەڵگەیێکـی تریشـمان بەدەستەوەیە، پشـتگیری ئـەم رایـە دەکا ئەویـش رسـتەی عەرەبـی (طـار خانـی الـی وبـە) کـە بـۆ مردنـی شـاعیر دانـراوە بـە حسـێبی ئەبجـەد دەکاتـە سـاڵی (١١١٩)، ئـەم سـاڵە بەرامبـەر بـە سـاڵی ١٧٠٧ی مەسـیحییە و راسـتتر کەوتۆتـە نێـوان هـەردوو سـاڵی ١٧٠٧ و ١٧٠٨ی مەسـیحییەوە.[1]

ئەحمـەدی خانـی یەکـەم شـاعیرە کـە گلەیـی لەسـەرۆک هۆزەکانـی کـورد دەکات لەبەرامبـەر یەکنەگرتنیـان و پشتبەسـتنیان بەنەیارانـی گەلـی کـورد ئـەو وتوویەتـی:

گـەر دێ هەبـوا مـە ئیتیفاقـەک
ڤێگـرا بکـرا مـە ئینقیـادەک
روم و عـەرەب و عەجـەم تەمامـی
هەمیـا ژ مـە تـا دکـر غولامـی
تەکمیـل دکـر مـە دیـن و دەولـەت
تەحلیـل دکـر مـە عیلـم و حیکمـەت

١- ئەحمـەدێ خانـی، مـەم و زیـن، دانەیـا عەزیـزێ کـورێ شـیرباری مامزێـدی ئـەوا ل سـالا ١١٦٥ کۆچـی هاتییـە نڤیسـین، بەرهەڤکـرن: تەحسـین ئیبراهیـم دوسـکی، دهۆک: سـپیرێز، ٢٠٠٨.

ئەحمـەدی خانـی، گرنگییەکـی زۆری بەزمانـی کـوردی داوەو کاتێـک بەزمانـی کـوردی شـیعری نووسـیەوە، تەنهـا هەربـۆ ئـەوە نەبـووە کـە بـەو زمانـە بنووسـێت، بەڵـکو بەکوردیـی نووسـینی وەکـو هەڵوێسـتێک بـووە لـەدژی دەسـەڵاتداران، هـاوکات وەکـو ڕەخنەیەکیش لەکوردەکان بەکاریهێنـاوە، چونکـە خانـی پێیوابـووە کـە زوو خۆیـان دەدەنـە دەسـت ئاغـاو دەسـەڵاتدارە بێگانـەکان.

**بەرهەمەکانی:**

عەقیدەیـا ئیمانـێ، بەپەخشـان و هۆنـراوە سـەبارەت بەپێنـج کۆڵەکـەی ئیمـان لەئیسـلامدا نووسـراوە. سـاڵی ٢٠٠٠ لەسـوید چاپکـراوە.

نووبەهـارا بچـووکان، ١٦٨٣، فەرهەنگۆکێکـی عەرەبـی کـوردی کـە بەشـیعر، بـۆ منداڵانـی کـوردی دانـاوە کـە فێـری زمانـی عەرەبـی ببـن کـە ئـەو سـەردەمە زمانـی دیـن و زانسـت بـووە. یەکەمجـار لەسـاڵی ١٩٢٦ لەرەوانـدز چاپکـراوە.

مـەم و زیـن، سـاڵی ١٦٩٢، یەکەمجـار لەسـاڵی ١٩١٩ لەئەسـتەنبوڵ چاپکـراوە.[1]

---

١- احمد خانی، مم و زین، استانبول: نجم استقبال مطبعەسی، ١٩١٩.

## مەم و زین ی ئێزیدی

چیرۆک و سترانی مەم و زین یان مەمی ئالان کە لەهەندێ ناوچەدا بەیتی مەم و زینی پێدەگوترێت ، لە زۆر دەڤەری کوردستان هەیە و بە گەلێک شێواز تۆمارکراوە. ئەم دەقەکاندانەی لەناوچەکانی ئێزیدییەکاندا هەیە لە باشووری کوردستان (شێخان، شنگال، خەتارێ) ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە ئێزدی چەند بایەخیان بەو سێ بەیتە داوە. دیارە دەقەکان لای ئەوانیش جیاوازیان هەیەم لەم پاژەدا هەوڵەدەم جیاوازییەکان بخەمە روو. چونکە هەرسێ ناوچەی (دەڤەری شێخان، دەڤەری شنگالێ، گوندێ خەتارێ ) سێ قەزای ئێزیدی نشینن لە پانیشتی کوردستان[1].

١- ناوی باوکی مەم لە هەموو دەقەکاندا میر ئالە، لێ ناوی هەردوو براکەی چین؟

- لە دەقی شێخانێ، ناوی مامەکانی مەمی ئالان عەلی پاشا، سلێمان پاشایە.

- لە دەقی شنگالێ، میر ئیسکی خان و میر ئۆسمان خانە.

- لە دەقی خەتارێ، تەمەر خان و ئاڤدەل خانە.

٢- تەمەنی باب و مامەکانی مەم (مەمی ئالان) چەندە؟ هەر سێ دەق دەڵێن باوکی مەم (ئال پاشا) برایێ بچوک بوو.

- لە دەقی شێخان، گەورەکەیان تەمەنی (٩٠) ساڵ و ناوەنجیەکەیان

---

١ - داود مراد خەتاری، مەم و زین (سێ ڤەرسیون ژ دەڤەرێن ئێزیدیان)، ئەنستیتویا کەلەپووریێ کوردی، چاپخانەی کارۆ ،سلێمانی ٢٠١١، ص١٢

(٨٥) ساڵ بچوکەکەش باوکی مەم (٧٥) ساڵ بوو.

- لە دەقی شنگالیّ، یێ مەزن تەمەنێ وی (٧٠) ساڵ و یێ ناڤی (٦٠) ساڵ و ئەوی بچوک باوکی مەم (٥٠) ساڵ بوو.

- لە دەڤەری خەتاریّ ، دەڵێت هەر سێ برا تەمەنیان گەورەیە و هەتا ئێستا خودا کوڕی نەداونەتێ.

٣- جۆری دەسەڵاتداری لە شاری موخرزەمین، بە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا چی دەگوترا؟

- لە دەڤەری شێخان دەگوترا پاشا.

- لە دەقی شنگالیّ (میر و خان).

- لە دەقی خەتاریّ (خان).

٤- کێ چوو مەلەکڤان، کچی میر سلێمانێ قورەیشی، خواست بۆ میر ئالی؟

- لە دەقی شێخان، سێ کۆتر هاتن، بەهەر سێ براکەیان گوت: بچن مەلەکڤان بخوازن بۆ میر ئالی. ئیدی هەر سێ برا چوون مەلەکڤان بخوازن.

- لە دەڤەری شنگال و لە دەڤەری خەتاریّ، میر عەمەر میرەکی تەرەف بەگیانە، چوو مەلەکڤان بخوازێت بۆ میر ئالی.

٥- مەلەکڤانی دایکی مەم، کچی میر سلێمانە یان خوشکی ؟

- لە دەقی شێخانێ، مەلەکڤان خوشکی میر سلێمانە.

- لە دەقی شنگالیّ، مەلەکڤان کچی میر سلێمانە.

- لە دەقی خەتاریّ، ئەمە باس نەکراوە، میر سلێمان دەڵێت: من داوە مەلەکڤانە.

٦- میر سلێمان چی دەڵێت لەبارەی مارەیی مەلەکڤان ؟

- لە دەقی شێخانێ، هیچ نەگوتراوە.

- لە دەقی شنگالیّ ، دوانزە قورووش ونیو.

- لە دەقی خەتاریێ ،حەوت قورۆش و نیو.

٧- بنەماڵەی باوکی مەلەکڤان میر سلێمانێ قورەیشی لە کوێ بوون؟

- لـە دەقـی شـێخانێ، بنەماڵـەی باوکـی مەلەکڤـان لـە گەڕەکێـک لـە گەڕەکەکانـی شـاری موخرزەمینـێ.

- لـە دەقـی شـنگالێ، لەشـاری موخرزەمیـن مـاوەی سـێ شـەو و سـێ ڕۆژ دووربـوو.

قۆناغا سێ شەڤ و سێ رۆژانە

ب قەوەتا خودێ رەبێ رەحمانە

هاژۆتبوو ڕێیا سێ سەعەتانە

گەهشتنە پشتا بەحرێت دنیانە

پەیابوو دەرێ مالا میر سلێمانە

- لە دەقی خەتارێ:

بچنە پشت بەحرێن بنیانە

بچینە مالا میر سلێمانە

بۆ تە ژێ بخوازین سۆزا مەلەکڤانە

ئەو ژ ئەسلێ وە قورشیانە

٨- چۆن لەتەمەنی گەورەساڵیدا میر ئالا خودا مەمی پێ بەخشی؟

- لـە دەقـی شـنگال و خەتـارێ: چونکـە میـر ئـالا تەمەنـی زۆر بـوو، زەمین جوبرائیل سێوێکی دایە و پێی گوت نیوەی بخۆو نیوەکەی تری بـدە مەلەکڤـان .

- لە دەقی شێخان ئەمە باس نەکراوە.

٩- مـەم چەنـد مانـگ لـە سـکی دایکـیدا مایـەوەو دواتـر خـودا هێنایـە دنیـاوە؟

- لە دەقی شێخانێ، نۆ مانگ و نۆ سەعات و نۆ دەقیقە.

- لە دەقی شنگالێ، حەوت مانگ.

- لە دەقی خەتاریێ، نۆ مانگ.

١٠- کێ زینی هێنایە باوەشی مەم خەواندی؟

- لە دەقی شێخانێ، خدر ئەلیاس و خدر نەبی، زینیان بەشەودا هێنا لە باوەشی مەم دا خەواندی.

- لە دەقی شنگالێ، سێ کۆتر (شالولڤان و بێزارڤان و قەمەرڤان) دووعایان لای خودا کرد و چون زینیان لە جزیری بۆتان هێنا بۆلای مەم

- لە دەقی خەتاریێ، ئەمین جبرائیل زینیان بەشەودا هێنا لە باوەشی مەم دا خەواندی.

١١- شاری (موخرزەمین) چی تێدایە؟

- لەدەقی شێخانێ، (٧٥) منارە، هەر منارەیەک حوکم دکات لە سەر ٣٦٦ ماڵدا.

- لەدەقی شنگالێ، (٧) چیا، ٣٦٦ بورجی دیارو بەرچاو.

- لەدەقی خەتاریێ، لە بنەوەی شاری موخرزەمین، حەوت ئاشی باوکی مەم هەن کە بە شەو و رۆژ کار دەکەن.

١٢- شاری باوکی زین چی تێدایە؟

- لەدەقی شێخانێ، حەوت بورج.

- لەدەقی شنگالێ، دە بورج.

- لەدەقی خەتاریێ، شاری باوکی زین خۆرستانە، هەر بەرەکی سۆرە ئێکی شینە.

١٣- کارەکەر (خودامین) زین کێن؟

- لەدەقی شێخانێ، سێ کارەکەر هەبوون ( گولێ، رەوشێ، بەسێ)

- لەدەقی شنگالێ، دوو کارەکەری هەبوون ( گولێ، پەری)

١٤- مەم چەند خولامی هەبوون و ناویان چییە؟

- لەدەقی شێخانێ، چل خولامی هەبوون، سەرۆکی ئەوان ناوی (مەمۆی خولام) بوو.

- لەدەقی شنگالی، سێ خولامی هەبوون (مەمۆ، بەدر، بەدی).
- لەدەقی خەتاری، ژمارەیان باس نەکراوە، تەنیا دەڵێت کە مەم بانگی خولامەکانی دەکرد ئامادە دەبوون.
١٥- ئال پاشا دەیویست بزانێت ئەگەری دەردی کوڕەکەی (مەم)ی چییە؟
- لە دەقی شێخانی، ئال پاشا سەرگەورەی دوانزە هۆز کۆدەکاتەوە تا بزانێت، دەردی کوڕەکەی (مەم)ی چییە؟

**چقاس رەملدارێن دوانزدە ئێلێن**

**تەمام بجڤیێن ل هێرە**

**رەملدارەک دبێژت:**

**ب وی کەم ئیلاهیە**

**زانینا من ژ رەملێ زانیە**

**مەمێ تە نە تاوی یە نە باوی یە**

**هاوار خودێ تیرەکە ئەڤینێ**

**ب دلێ وی کەفتیە**

- لە دەقی شنگالی، باوکی مەم گوتی بە دانا و ئاقڵەکان : پێویستە مەسەلەی مەمۆ بزانن، چۆن و بە چ ڕێگەیەک چارەسەر دەکرێت.
هەموو گوتیان : تیری ئەویندار‌ی دڵی مەم ی پێکاوە دای.
میر ئالا گوتی: تیری ئەوینداری چییە؟
زاناکان گوتیان: عەشق و ئەوین دڵی بردوە بزانە شەو خەوی بە چ کچێکی جوانەوە دیوە.
- لە دەقی خەتاری، عارفێک دەڵێتە ئال پاشا:

**ئال پاشا مەمێ تەیێ دەلال**

**نەی تاوی یە، نەی باوی یە**

**نەی بئێشە نەی برسی یە**

**تیرا ئەویندارى دلێ مەمێ تە گرتییە**

١٦- کێ ئاگادارى خەڵکى کرد تا تەواوى کچانى شارى موخرزەمین بێنە باغى سەیران؟

- لە دەقى شێخانێ:

**هەر کەسێ قەدرێ من تێ ببینت.**

**دەریێن سووک و دکانێن**

**باژارێ موخورزەمینێ بێ خودان بهێلن**

**کەچێن بەگان و عەیانا هەتا بێن شڤان و گاڤانا**

**راتب و رهێلێن ب دلێن خۆ هلینن**

**بچنە کۆچکا ناڤ رەزى**

**ل بەر مەمێ شرین بسەکنینن**

**بەلکى مەمێ من ئێکێ ژ هەمووا بهلینە**

- لە دەقى شنگالێ، میر ئال تەواوى کچانى شارى موخرزەمینى ئاگادارکردن کە سبەینێ هەمویان لە دیوەخان ئامادە بن.

- لە دەقى خەتارێ، گزیریان بەردایە ناوشارو هاوارى دەکرد : هەموو کچانى شار بێنە باغى سەیران.

١٧- کاتێک مەم لەسەر داواى باوکى چویە باغى سەیران،تا کچێک لەوانە بۆخۆى هەڵبژێرێت، کچێک گوتى....

- لە دەقى شێخان:

**تەورێز و خۆش تەورێز**

**چقاس قیزێن باژارێ موخورزەمینێ بوونە رێز**

**کەرەمکە ئێکێ ژ هەمووان ژ خۆ را ڤەگوهێز**

**کچێکى دیکە گوتى:**

**مەمۆ سەرێ خۆ هلینە**

**قیزێن باژارێ موخورزەمینا گران د جەماندینە**

**کەرەمکە ئێکێ ژ هەمووان ژ خۆ را هلینە**

**– لە دەقی خەتارێ، کچێکی شارەزا لەناو کچەکاندا بوو گوتی:**

**ئەرێ مەمۆ توو سەرێ خۆ هلینە**

**مانە ئەم سێسەد و شێست و شەش قیزێت خەملاندینە**

**ئێکێ ژ هەمووکا ب خۆ ژ ناڤ بنەقینە**

**– لە دەقی شنگالێ:**

**ئەرێ مەمۆ ئەم (٣٦٦) زەریێت خەملاندینە**

**مەمۆ لاوۆ چاڤا ڤەکە، سەرێ خۆ بهەلینە**

**ژ ڤان (٣٦٦) زەریا ئێکێ ژ خۆ را بنەقینە**

١٨- مەم بەمجۆرە وەڵامی دایەوە:

- لە دەقی شێخان:

**یا قیزا قەنج**

**بابێ من چەندی دینە**

**یا من دڤێت خاتوون زینە**

**کیژا میر زێندینە**

**خوشکا میر سێڤدینە**

**دۆتمانا چەکان و عەفان**

**بالتیسکا  قەرە تاژدینە**

**د بەرکرنا وێ**

**دەلق و بەردەلقێن زێرینە**

**هینجی چاڤێن خۆ دگێرینم**

**ئێکە ب کێر جێریاتیا وێ بێ**

**د ناڤا دا نینە**

**– لە دەقی خەتارێ:**

**ئەرێ بتێ دینێ**

**ب خودێ یا ئەز لێ دگەرێم ل ناڤ وە دا نینە**

**یا لێ دگەریم زینا خاتوون زینە**

**خودانا دەلق و دامانێت زێرینە**

**کیژا میر سێڤدینە**

**خوشکا میر سلێمانە**

**دۆتماما چەکانی و عەفانی و قەرەتاژدینە.**

**باژێرێ بابێ وێ باژێرێ خۆرستانێ**

**نیشانێت باژارێ بابێ وێ هەر بەرەکی سۆرە و ئێکی شینە**

**ئەرێ بتێ دینێ ب خودێ وەکە وێ د سلسلا بابێ ئێک وە دا نینە**

**- لە دەقی شنگالێ:**

**ئەرێ بتێ یا ئەز لێ دگەرێم ل ناڤ وە دا نینە**

**یا لێدگەرێم زینا خاتوون زینە**

**کچا میر سێفدینە خوشکا میر زێندینە**

**دۆتمامە چەکان و عەفان و قەرە تاژدینە**

**باژێرێ بابێ وێ جزیرا بۆتا ب خۆ رەنگینە**

١٩- مەلەکڤان (دایکی مەم) دەیویست کوڕەکەی نەڕوات:

- لە دەقی شێخانێ، مەم ماڵئاوایی لەماڵ خواست دایکی زۆری لێ پارایەوە بەڵام سوودی نەبوو.

- لە دەقی شنگالێ، (مەلەکڤان) هات و لەبەر مەم وەستا و گوتی:

**مەمێ من دلێ من دیانە**

**تو بەرێ خۆ بدە ڤان هەڤال و هۆگرانە**

**تو بەرێ خۆ بدە باژێرێ موخرزەمینێ**

**باژێرەکی عەزیم یێ گرانە**

**ڤی باژێرێ موخرزەمینێ نەهێلە بێ خوەیی بێ خودانە**

**ژ بەر خەونێن شەڤانە**

**وێڵ فەلەکێ وێڵ وێڵ دنیایێ وێڵ**

- لە دەقی خەتارێ:

مەلەکڤان دەڵێت: ئەگەر توو نادەیە خاترا بابێ و هەردوو مامانا

بدە خاترا دایکا خۆ یا مەلەکڤان پشتی تە ئێتیمە ل ڤان چیانە

هەی فەلەکێ وێڵ هەی دنیایێ وێڵ

٢٠- کاتێک مەم رۆیشت تا بەخەوەکەی شەوی بگات کێی لەگەڵ رۆشت؟

- لە دەقی شێخانێ، چل خولام سواری ئەسپەکانیان بوون و لەگەڵ مەم رۆشتن و شاری موخورزەمین بویە هات و هاوار و بەهەزاران خۆیان خستە بەرپێی تا نەڕوات.

- لە دەقی خەتارێ، مەمۆی خولام لەگەڵ مەم بەڕێکەوت لەشار دەرکەوتنە دەرێ دوای چەند دەقەیەک مەمۆی خولام دەنکە خورمایەکی خستە دەمی.

مەم: ئەوە چییە دیخۆی؟

مەمۆی خولام :دەنکە خورمایەک بوو لە بنی هەگبەکەما خستمە دەممەوە.

مەم: بۆچی بەمنت نەگوت؟

مەمۆی خولام: شتێک نەبوو هەتا بەتۆی.

مەم لێی سڵەمییەوە، داوایکرد لە مەمۆی خولام کە بگەڕێتەوە و مەم بەتەنها رۆشت

٢١ دوای مردنی مەم زین چی کرد و چۆن مرد؟

- لە دەقی شێخانێ، کاتێ زین، مەمی بەم شێوەیە بینی دەستی بە هاوارکرد، میر و خەڵکێکی زۆری شار هاتن و میر گوتی: کچم خەم مەخۆ گەلێ کوڕی جوان لە جەزیرا بۆتان هەن یەکێکیان بە دڵی خۆت هەڵبژێرە، زین بە دڵی ماتەمبارەوە گوتی:

نە جزیر بیت نە بۆتانە

خودێ خراب کەت ژ بنیانە

هەوارا خۆ دگەهینمە شەخسێ پەسارێ

مەم سبێ مر

زین نەگەهتە بێریێن هێڤارێ.

- لە دەقی شنگالیێ، زین هات لەلای ئەوانەدا وەستا کە گۆڕی مەمیان هەڵدەکەند و گوتی: با گۆڕەکەی فراوان بێت، کاتێ مەمیا شۆڕکردەوە ناو گۆڕ زین شمشێرێکی لەسەر دڵی خۆی چەقاند و خۆی بەردایەوە ناو گۆڕەکە.

- لە دەقی خەتارێ، زین لای خوداوەند دوعای کرد تا هەردوو پێکەوە بمرن و لەیەک گۆڕدا بنێژرێن.

لێرەدا دەبینین لەنێو خودی کۆمەڵگای ئێزیدیدا لەسێ دەڤەری جیاواز یەک دەق چەندین جیاوازی هەیە، کەواتە دەتوانین بڵێین هەر ناوچەو دەڤەرێک شەقڵ و مۆرکی بومی پێوە دەلکێت و ئەمەش حاڵەتێکی تەندروستە بۆ پرۆسەیەکی لەمجۆرە.

## ٢- مەم و  زین لە لای ئۆسکارمان

لـە توحفـەی موزەفەریـەی ئۆسـکارماندا بەیتێکـی مـەم وزیـن هەیـە بـە سـۆرانییە، ئۆسـکارمان لـە زاری رەحمان بەکر وەری گرتـووە، لەشێوەی بەییت دایـە و رەچـاوی فۆرمـە شـیعرییەکە نەکـراوە.

ئـەم چیرۆکـە وەک هەمـووی چیرۆکـە کوردیـەکان بـە گشـتی و هەمـوو چیرۆکـە کۆنەکانـی دنیـا لـە سـەرەتاوە بـە شـێوەی زارەکـی لـە زمانـی شـایەرەکانەوە (کـە بـە بەیـت بێـژ دەناسـرێن) گوتـراوە، هـەر بۆیـە جیاوازی و تێکەڵ بوونـی توخمەکانی گێڕانـەوە، لـە ئەدەبی زارەکـی ئـەم شـتێکی حاشـاهەڵنەگرە.

هـەر شـایەرێک بـە پێـی پێخۆشـبوونو بۆچوونـی خـۆی هەندێـک شـتی لـە چیرۆکەکـەدا زیادکـردوەو یـان گۆڕیویەتـی، ئـەم دەسـتیوەردانە تـا ئەوکاتـەی کـە چیرۆکـەکان تۆمـار نەکـرا بـوون زۆر زەقتـر بـوو .

لـە بـارەی مـەم و زینـەوە ئـەوەی لـە بەردەسـتدایە گێڕانـەوەی رەحمـان بەکری شـایەر کـە ئوسـکارمان تۆمـاری کـردوەو وادیـارە شـێوەی بـاو لـە نـاو بەیـت بێژانـی رۆژهەڵاتـی کوردسـتاندا هـەر ئـەم گێڕانـەوەی رەحمـان بەکـر بـووە (چونکـو بـە وتـەی ئوسـکارمان جیـاوازی نێـوان گێڕانـەوەی شـایەرەکان بـە گشـتی زۆر کـەم بـووە.)

بەیتـە کوردییـەکان سـەرنجی زۆرێـک لـە رۆژهەڵاتناسـان و نووسـەرانی بیانییـان بـۆ لای خۆیـان راکێشـاوە، بەربڵاوتریـن هـەوڵ ئۆسـکارمانی رۆژهەڵاتناسـی گـەورەی ئەڵمانیـای ئەنجامـی داوە. ئۆسـکارمان خزمەتێکـی مـەزن و بەرچـاوی بـە زمـان، فەرهەنـگ و ئـەدەب و مێـژووی نەتەوەیـی کـوردان کـردووە، خزمەتێکـی دەگمـەن و فەرامـۆش نەکـراو، بـە چەشـنێک کـە نـاوی ئـەم بیرمەنـد و دڵسـۆزە بێگانەیـە لـە مێـژووی ئەدەبـی کـورددا

بە نەمری هێشیۆتەوە.

ئۆسکارمان، ساڵی ١٨٦٧ لە بەرلینی ئەڵمانیا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە

لە ساڵی ١٩١٧ کۆچی دوایی کردووە.

ئۆسکارمان لە ساڵی ١٩٠١ هەتا ساڵی ١٩٠٧ و لە ساڵی ١٩٠٨ هەتا ١٩١١ی زاینی بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەبارەی زمانەکانی کوردی و فارسی سەفەری ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئێرانی کردووە.

ساڵی ١٩٠٣ی زایینی سەردانی مەهابادی کردووە و لە ماوەی نیشتەجێ بوونی لەو شارە جیالە کۆکردنەوەی ١٧ بەیتی کوردی (دمدم ـ مەم و زین ـ لاس و خەزاڵ ـ ناسر و ماڵماڵ ـ برایمۆک ـ شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ ـ مەحمەل و برایم دەشتیان ـ قۆچ عوسمان ـ جولەندی ـ خەزێم ـ کاکە میر و کاکە شێخ ـ لەشکری ـ قەر و گوڵزەر ـ زەمبیل فرۆش ـ باپیرئاغا ـ عەلی عاشق و عەبدولڕەحمان پاشای بابان) کۆمەڵێکی زۆر بابەتی ڕێزمانی و فەرهەنگ و دەستەواژەی کوردی، نزیک بە ٢٠٠ غەزەل و گۆرانیی کوردی لە زاری گوندنشینێک بەناوی (ڕەحمان بەکر )ەوە کۆکردۆتەوە و وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی و ساڵی ١٩٠٥ی زایینی لەژێر ناوی بەیت و باو و ئەدەبی زارەکیی زاراوەی موکریانی بە هەمان ئاخاوتەی سەرەکی و بە ڕێنووسی لاتینیی تایبەت لە بەرلین بە چاپی گەیاند.[١]

١- ئۆسکار مان، توحفەی موزەفەرییە، ساغ کردنەوەی : عەلی نانەوازادە، هەولێر ٢٠١٣، چاپخانەی حاجی هاشم، لەبلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، لا ٧٩

جگە لە ئۆسکارمان چەند ناوێکی تر هەن ئەوانیش جێپەنجەیان بەسەر ئەدەبی کوردییەوە دیارە و دەبێت ئاماژەیان پێبکرێت لەوانەش:

کراولینسۆن (H.CRAWLINSON)، شودزکۆ (A.CHDZKO)، لیرش (P.LERCH)، شنیدلر (A.HOTOMSCHIADLER)، پریم (PRYM)، سوسین (SOCIN)، رسیویل (JABA RECUEIL) مار (MAR)، مینورسکی (MINORSKY)، واسیلی نیکیتین، رۆژە لسکۆ، وایگرام، میلنگن، رۆدینکۆ (AM RADUDENKO) و مایکل چات وسون ئەو نووسەر و لێکۆڵەرانەن کە ساڵانێکی زۆر لە تەمەنی خۆیان بۆ کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بەیت و ئەدەبی زارەکیی کوردی تەرخان کردووە.

گێڕانەوەکەی رەحمان بەکریش بە بۆنەی تێکەڵ کردنی چەندین ئوستوورەو دەقی ئایینی جیاواز لە ناو ئوستوورەیەکی تایبەتدا، رەنگە خوێنەری شارەزا تووشی سەرلێشێواوی بکاتو ناوەڕۆکی ئوستوورەیی چیرۆکەکەی لێ ون بێ.

لە دنیای ئوستوورەناسیدا زۆرجار هەیە کە لە نێوان ئوستوورەی چەندین نەتەوەی جیاوازدا توخمی ئوستوورەیی هاوبەش دەکەوێتە بەرچاو، تەنانەت جار هەیە کە ئوستوورەی نەتەوەیەک دەقاودەق لە ناو نەتەوەیەکی بەرواڵەت دوور لە نەتەوەی پێشوو دەبیندرێو تەنیا ناوەکان دەگۆڕدرێن کە بەم ئوستوورانە دەڵێن ئوستوورەی هاوتەریب. لە رێگای ئوستووره هاوتەریبەکانەوە زانیاری زۆر لە بارەی پێوەندی نێوان نەتەوەکانو هەروەها مێژووی هاوبەشی ئەوان یان شێوەی ژیانی ئەو نەتەوانە دەکەوێتە دەستی توێژەرو رەنگە بازنە ون بووەکانی مێژووی نەتەوەیەک بە هۆی ناسینی ئوستوورەکانی وەدەر کەوێت.

مەم و زینی تۆمارکراوی ئۆسکارمان لە بەشێک لە چیرۆکەکەدا مەم بە ئاشکرایی زین رەت دەکاتەوەو سێجار بە دوای یەکدا دەڵێ کە زینی ناوێ. ئەگەرچی چیرۆکخوان هۆکاری ئەو هەڵویستەی مەم کارتێکدەری بەکر دەزانێو دەڵێ بەکر بە گوێی مەمی گەیاندوە کە زین نەخۆشی پیسی گرتوە، بۆیە کاتێ میر زێنەدین (برای زین) سێ جار زین بە مەم دەدات ئەو هەو سێ جارەکە رەتی دەکاتەوەو ئەڵێ نامەوێ.

لە گێڕانەوەی رەحمان بەکردا رەدکردنی زین لە لایەن مەمەوە دەبێتە بەردی بناغەی کێشەی میرو مەم و لە ئاکامدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی زیندانی بوونی مەم.

لە بەیتی مەم و زیندا، شێوەی لە دایک بوونی مەم باسی چۆنییەتی خولقانی یەکەم مرۆڤ دەکاتو پاش ئەوەش دەچێتە سەر بەشێکی دیکە لە دابونەریتی هەرە کۆنی ئینسانو بەو شێوە رەوتی ژیانی مرۆیی وێنا دەکات.

مەم لە سەرەتاوە نۆکەرێکی هەیە بە ناوی بەنگینە (کوڕی وەزیری پاشا، کە ئەڵبەتە لە مەم و زینی خانیدا باسی لێ ناکرێو ئەو کەسەی کە رۆڵی هاوڕێی مەم دەگێرێ قەرەتاژدینە ) مەم و بەنگینە دوای لە دایک بوون بەسەرهاتێکی سەیروسەمەریان هەیە. بەیتەکە دەڵێ:

بە دایانیان دان، دوو ساڵ لە کن دایانێ بوون لە پاشان بە لەلەیان دان، سێ ساڵ لە کن لەلەی بوون لە پاشان سواریان کردن دووساڵان سوار بوون ئەوجار هێنایانن بردیاننە مەدرەسەی لە خزمەت مامۆستا دانیشتن، حەوساڵان دەژێرخانێدا بوون رۆژو شەویان لێ قەدەغە کردن...

مـەم وبەنگینـە بـە شـێوەیەکی هەڵکـەوت پەنجەرەیـەک بـەرەو دەرەوەی ژێرخانیـان بـۆ دەر دەکەوێـت:

«تیشـکی رۆژ هاتـە ژووریٚ، ئەسـتەغفروڵلا گوتیـان ئـەوە خوڵایـە مامۆسـتای وان لـە ویٚ نەبـوو هـەر ئامێزیـان لـە تیشـکی وەدەر هێنـا بۆیـان نەدەگیـرا... گوتیـان ئـەوە خوڵایـە هاتۆتـە نێـو مـە...»

زمانـی بەیـت بێـژ لـەم بەشـەدا دەبێتـە زمانێکـی مـەوزوون و لێـرە بـەدواوە بـە وردی هەمـوو وردەکاریەکانـی ماجەراکـە بـاس دەکات:

«شـەوێک سـیٚ پـەری دێنـە سـەر کۆشـکی مـەم دوای هێندیٚ قسـە لـە سـەر جوانـی مـەم و زیـن، هـەر لـە شـەودا زیـن لـە جزیـرە دەگوازنـەوە بـۆ کۆشـکی مـەم».

شـایەر ئەگەرچـی ئـەم گواسـتنەوە زۆر درێـژە پێـدەدات بـەڵام زمانێکـی شـیرین و گێڕانەوەیەکـی جوانـی هەیـە کـە گوێگـر دەباتـە دنیـای خەیاڵـو ئیزنـی ئـەوەی دەدات تـا هەمـوو وردەکاریەکانـی وتووێـژی پەرییـەکان و دیـداری مـەم و زیـن وەبەرچـاو بێنێـت. لێـرەدا بەشـێکی کورتـی داسـتانی ئـەو شـەوە بـۆ ئاشـنا بوونـی خوێنـەر لـە گـەڵ زمانـو دەربڕینـی ناسـک و خەیـاڵاوی شـایەر دەگێڕینـەوە:

خالق هەر ئەتۆی لە سەرە

سیٚ پەری لە ئاسمانی حەوتەمین بەستوویانە لەنگەرە

لە سەر کۆشکی کاکە مەمی هەڵدەنیشن ئەوبەر ئەوبەرە

خوشکی گەورە دەڵیٚ بە خوشکی چکۆلە

خوڵاکەی خوشکی رومەتی کاکە مەمی زەریفە یان چراو فەنەرە؟

خوشکی نێوەنجی وای گوتیە

هەر لە عەرشی تا کورسییە

هەر لە گای هەتا ماسییە

هەموو دنیام پشکنییە

هیچکەسم نەدیوە لە گوێن جوانی کاکە مەمییە...

لەبەیتی مەم و زینی رەحمان بەکردا مەم کوڕی ئیبراهی پاشای یەمەنە، داستانی لەدایک بونی مەم بەم جۆرەیە:

«برایم پاشا هیچ کوڕی نەبوو، لەگەڵ وەزیری خۆی هەستان رۆین بۆماڵە خولا، دوازدە مەنزڵان رۆین، خولا رەحمی بەوان کرد، وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتی ناردیە کن ئەوان، دوو سێوی پێدا نارد، گوتی بچنە ماڵە خۆتان، دەزانم بۆ کوڕی هاتوون، شەوی جومعەی دەستنوێژ هەڵگرن، ئەو سێوەی لەت بکەن لەتێکی بەخۆت بیخۆ لەتێکی ژنەکەت».

ئەم باسە لەلای خانی نابیستین، ئەمە جگە لەوەی کە لای خانی مەم شازادە نییە بەڵکو کوڕی نووسەری میرە.

## ٣- مەم و زین ی رەواندز

بەهەمان شێوە لای ئۆسکارمان بەیتێکی تری مەم و زین تۆمار کراوە، لەمەیاندا کە زۆر کورتە و بەیتێکی قافیەدارە.

لەم بەیتەیاندا کاکە مەم نۆکەری میری رەواندزە و خاتو زینیش خوشکی میری رەواندزە .

کاکە مەم نۆکەری میری رواندز بوو، خاتووزین خوشکی میری رواندز بوو، کاکە مەم دڵی لێچوو، ئاشق بوو لەخاتووزین، میرمەم ئاغای نەخۆش کەوت، پەنج ساڵ تەواو، کاکەمەم ئاغای بەکۆڵ گیرای، لەدوای ئەم پەنج ساڵە شەرتی کرد، کەخوشکی خۆی بداتیێ، پیاووماقوڵان جەم بوون، قەبوڵیان نەکرد، ئاقیبەت زین و مەم ئاشق بوون بەیەکتر، خاتووزین کاسەی ئاو دای بە کاکەمەم، میر پێیزانی، زستان بوو، حوکمی کرد " ئەسپێکم بۆ بێنن، کاکە مەمی سوار کەن، وە گۆزەیە ئاوی پیا بکەن، با بیبەستێ،دەری کەن، با بڕوە بۆ کۆییێ، دەریان کرد، بەو شەوە روویی، بە کاو بەفر و سەرما، تا نزیک بەیان، داغل بەشار کۆیە بوو، ئەسپەکەی بەڵەد بوو، لەبەر دەروازەی میر راوێستا، حیناندی( حیلاندنە)، میر بەخەبەر بوو، بانگی کردە غوڵامان، دەروازە بکەنەوە، بزانن ئەوە کێیە، کە چوون ، دەروازەیان کردەوەم داییان بەزانت، هاوردیانە ژورەوە، میر کە تەمەشای کرد، هەموو گیانی بەستووگیە، لێیپرسی گوتی: «چی کردووە بەم شەوە ساردا توویان دەرکردووە؟»

ئەرزی کرد: «لەبری چاکەی ک لەگەڵ برای توەم کرد ئەمە جەزای بوو.» میری کۆی گوتی: «سبەینی سەد سوار دەنێرم خاتووزینت بەزۆر بۆ بێنن ئێرە» زۆر حەمدی خودای کرد.

بەیتەکە....

جوابێ بنێرن بۆ شەمزینان:

سوار بن لە ئەسپ و زینان،

بۆ شەوقی مەم و زینان

جانان! بیکەن تەقبیر و رایێ!

جوابێ بنێرین بۆ زازایێ

سوار بن لەبۆ ئەم سەفایێ!

دڵەم دەڵێی بەحری وانە،

لەنگەریان تێبەردان گەمییەوانە

جوابێ بنێرن بۆ بالەکان

سوار بن لە کوێت و هەڵەشان

لەبۆ سەفای کیژ چاوڕەشان

کوێستانان لە من داغان داغان

سوورگوڵ پشکووت لە چوارباغان

کاکە زێن و براڵە زێن و کیژە رێحانە

ئاورێکم بەربووەتەوە لە دەروونێ!

نە بە بایێ دەکوژێتەوە نە بە بارانێ

نە بە پاچ و پێمەڕان، نە بە گڵ پیادانێ

نە بە شێخ ئەستوور کرێوە، نە بە چاکە سواری تاژانێ،

نە بە سێید ئەحمەد ساوانێ،

نە بە تیپی سوارانی دەشتی کاولە حەریرێ،

نە بە گوڵەنگەو قۆیتاسەی کاری مووسڵێ.

## لێکچووەکانی مەم و زینی خانی و ئۆسکارمان

- لە هەردوو گێڕانەوەکانی خانی و ئوسکارماندا باسی شین بوون و سەرهەڵدانی گیا یان گوڵێک لە سەر مەزاری مەم و زین کراوە.
- لە سەرەتای مەم و زینی رەحمان بەکردا (تۆمارکراوی ئوسکار مان) لە گەڵ کەشوهەوایەکی ئوستوورەیی رووبەڕو دەبینەوە: پاشایەک کوڕی نابێت و بە دوای رازونیاز لە گەڵ خوداو پاڕانەوەی زۆر، بە هۆی سێوێکی بەهەشت دەبێتە خاوەن کوڕێک و ناوی دەنێتە مەم. دەقی بەیتەکە لە بارەی چۆنیەتی لە دایک بوونی مەم (کە سەرەتای چیرۆکەکەیشە) ئاوا دەستپێدەکات:

«ئیبراهیم پاشای یەمەن هیچ کوڕی نەبوو، دەگەڵ وەزیری خۆی هەڵستان رۆین بۆ ماڵە خوڵا، دوازدە مەنزڵان رۆین، خوڵا رەحمی بەوان کرد. وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتی ناردیە کن ئەوان، دوو سێوی پێدا نارد... ئەوانە بۆ کوڕی هاتوون بچنە ماڵە خۆیان شەو جومعەی دەسنوێژێ هەڵگرن، ئەو سێوەی لەتی بکەن، لەتێکی بۆ خۆی بخوا لەتێکی ژنی...»

- بەڵام لە گوتنەوەکەی خانی دا نە باسی سێوی بەهەشت دەکرێت و نە مەمیش شازادەیە، بەڵکو کوڕی نووسەری میرە.
- لە بەیتەکەی رەحمان بەکردا مەم لە سەرەتاوە نۆکەرێکی هەیە بە ناوی بەنگینە کوڕی وەزیری پاشا.
- لە مەم و زینی خانیدا باسی لێناکرێ و ئەو کەسەی کە رۆڵی هاوڕێی مەم دەگێڕێ قەرەتاژدینە .
- بەیتەکە دوای هاتنە دەرەوەی مەم و بەنگینە باسی یەکەم دیداری مەم و زین دەکات. لە بەیتە تۆمار کراوەکەی ئۆسکارماندا ئەو

یەکەم دیدارە زۆر خەیاڵاوی و ئوستوورەییەو چیرۆکەکانی هەزارو یەک شەو و داستانەکانی جنۆکەو دێو و پەریمان وەبیردێنێتەوە واتە رواڵەتی رۆمانسەکانی سەدەی شازدەو حەڤدەی هەیە کە لە ئێران دا عەییارنامەکان بەو شێوازە بوون.

- خانی مەم و زینی لە جەژنی نەورۆزدا بەیەکتر ئاشنا کردوە. مەم و تاژدین بە جلی کچانەوە دەڕۆن بۆ جەژنی نەوروز، لەوێ چاویان بە دوو کوڕە لاوی جوانو چالاک دەکەوێ کە خەریکی زۆران و شەڕن و کەس نایانبەزێنێ. مەم وتاژدین وەدوویان دەکەون بۆیان دەردەکەوێ کە ئەوانە کوڕ نەبوون بەڵکوو دوو کچی جوان بوون. هەر لەوێ عاشقیان دەبن، کچەکان ئەنگوستیلەی خۆیان لە گەڵ کوڕەکان دەگۆڕنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ کۆشکی خۆیان.

- لە بەیتی دووەمی ئۆسکارماندا ئەوەی لە رەواندزە جۆرێکی ترە، لەم بەیتەیاندا کاکە مەم نۆکەری میری رەواندزە و خاتو زینیش خوشکی میری رەواندزە و ئاکامەکەش بەوە دەگات مەم لە رەواندزەوە بەرەو کۆیێ دەردەکرێت.

دەکرێت زیاتر لەسەر ئەم باسە بدوێین بەڵام ئەوەی بۆمن گرنگە ناساندنی دەقە هەورامییەکەی مەم و زینە کە دەمەوێت باسەکە لەسەر ئەو بابەتە چڕ بکەمەوە.

## ئوستوورە

مرۆڤـەکان هەمیشــە لەخەیاڵـی خۆیانـدا چیرۆکیـان دروسـتکردووە، خەیـاڵ ئـەو جیهانەیـە کـە زانـاکان لەگـەڵ پێشـکەوتنی تەکنەلۆژیاشـدا دەتوانـن شـتی نوێـی تێـدا هەڵبهەنجێنـن[1]

ئوسـتوورە ئـەو چیرۆکەیـە کـە دانەرەکـەی یـان رەگەزەکـەی شـاراوەیە و هەوڵ دەدا رەوتەکانـی سروشـت، بەدیهاتنـی جیهـان و مـرۆڤ، نەریتـەکان و ئاهەنگـە ئایینییـەکان دەربـبڕێ. ئوسـتوورە لـە بنەڕەتدا وەکوو سیسـتەمێک بـۆ راڤـەی جیهـان یـان بەرپەرچدانـەوەی مرۆڤـی سـەرەتایی لـە هەمبـەر هێـزە سروشـتییە نەناسـراوەکاندا داڕێـژراوە. سـەرەکیترین کەسایەتییەکانی نـاو ئوستوورەکان خـواکان یـان پاڵەوانـە لەئاسـابەدەرەکانن.

ئـەم جـۆرە گێڕانەوانـە داگـری ئـەو چیرۆکانـەن کـە هەڵگـری واتـاو ناوەڕۆکـی ئوسـتووریی و حەماسـین و لـە گێڕانەوەکانـی خۆیانـدا ئامـاژە بـە زەمەنێکـی نادیـار دەکـەن. [2]

ئوستوورە، نهێنییەکانی پێشینانی ئێمـەن، ئـەو نهێنییانـەی نەیانتوانیوە بەڕاشـکاوی دەریبـڕن. هـەر ئـەو نهێنییانـە بوونەتـە زمانـی هێمایـی بـۆ دێـو و درنـج و بابەتـی لـەم چەشـنە.

دنیـای ئوسـتوورە پـڕە لـە ڕاسـتی. پڕە لـە ئـاوات و ئـارەزوو و حـەز. میرچـا ئەلیـادە دەڵـێ: « ئوسـتوورە مێژوویەکـی پیـرۆز دەگێڕێتـەوە.»[3]

١ – تأريخ الاساطير، كارين أرمسترونغ، ترجمة د. وجية قانصو, ط١ ٢٠٠٨م،دار العربية للعلوم ناشرون،بيروت، ص٩

٢ – شانامەی کوردی، بێهرووز چەمەن ئارا، چاپەمەنی مانگ، ٢٠١٦، ل١٨

٣- اسطوره و واقعيت ، ميرچا الياده، ت.مانی صالحی علامه، بنگاه ترجمه و نشر كتاب پارسه، تهران ١٣٩٢، ص٥٣

ئەسکیمۆییەکان بۆ سەلماندنی مێژووی پیرۆز و نەریتە ئایینییەکانی خۆیان دەڵێن: « ئاوایە، چونکە گوتراوە کە ئاوایە.»

کارڵ ئابراهام لایەنگری فرۆید، لەسەر ئەو بڕوایەیە کە ئوستوورە بیرەوەریی دابونەریتێکن لە کۆمەڵگەی سەرەتاییدا باو بووە. بەڵام پاشان پێشی گیراوە و وردە وردە خراوەتە ژێرچەپۆکە و بەشێوەی ئاواتە نەگوتراوەکان لەنێو نائاگایی کۆمەڵدا ماوەتەوە.

## تایبەتمەندیی ئوستوورە بومییەکان:

١- فۆرم: هەروەک دەزانین هەموو حەکایەت و ئوستوورەیەک بە فۆرمێکی تایبەت دەستپێدەکا. فۆرمی دەستپێکردنی ئوستوورە بومییەکان بریتین لە: هەبوونەبوو، ، دەسپێکردنە بە مەدح و سەنا کەبەناوی خودا دەست پێدەکات و بە ستایشی محەمەد درێژەی پێدەدات، لە داستانی مەموزین ی هەورامیشدا ئەمە بەرچاو دەکەوێت:

بە نام بێچوون بەنای لا مەکان
نگەهدارەندەی زەمین و زەمان
واحد و ئەحەد فەرد و فریاد رەس
ڕاحم و ڕەحیم پەی بێکەسان کەس
پادشای قەییۆم واحد و مۆتڵەق
نگەهدارەندەی چەرخ مۆعەلەق
ڕزق دەهەندەی وەحشی و موور ومار
پادشای بێ عەیب واحدولقەهار

بە غەیرەز ئەو شا کەس نیەن شاهان
شاه هەر ئەو شاهەن نە هەردوو جەهان
زاهر و باتن لامەکان ماوان
سونعش بێ شێوەن زاتش فراوان
ئەر وەسف زاتش مەکەروو ئزهار
تەمام نمەبۆ نە شەرح تۆمار
ئومێدم ئیدەن پادشای ئەعزەم
بە ئەلتاف وێت بداریم و چەم
دەور رەستاخێز ئاخرزەمان بۆ
مەخلووقات تەمام نالەئەمان بۆ
ببەخشیم بە ناز موستەفای مۆرسەل
نیازم ئیدەن بەنای لەم یەزەل

یەکێکی تر لەو خاسیەتانە خۆبەکەم زانین و خوبەتاوانبارزانینی گێرەرەوە یان حیکایەتخوانە و باسی تاوانباری خۆیدەکات و داوای بەخشین دەکات

گەر چ کەردەنان ستەمان بەر خوێش
بوویەر جە کردار ئی بەندەی دڵرێش
چون ئەندێشەم هەن جە دەریای جوودت
دڵبەندەن بە ئان نەقش عهوودت
بە مەحز لوتفت ئومێدەوارم
وێت فەرموودەنی ئامۆرزەگارم
غەرق جە قەباحات موتەهەم جە زەنب
(اغفرلی اغفریا غافرالذنب)

نووسەر یان گێڕەرەوەو حیکایەتخوان لەگێڕانەوەکاندا بەر لەوەی بچنە سەر کرۆک و ئەسڵی داستانەکە دێن کورتەیەک و ئامانجی کارەکەیان بەیان دەکەن:

**ئەوسا دۆمای مەدح یەکتای یەگانە**
**گۆش دەر و دەستان دەور زەمانە**
**بەتاڵ نمەبۆ نوێشتەی تەقدیر**
**تەقدیر علاجش نیەن بە تەگبیر**

٢- کارەکتەرەکان: سەبارەت بە تایبەتمەندیی کارەکتەر و ناوەڕۆکی ئوستووره بومییەکان وەک ئوستوورەی زۆرێک لەگەلانی ناوچەکەیە چونکە زانستی مرۆڤناسی، ئوستووره بە پاشماوەی ئایینە سەرەتاییەکان دەزانێ، دەتوانین ئوستووره بە بنەمای ئایینی دابنێین، جێپەنجەی بڕوا ئایینییەکانی سەرەتای ژیانی مرۆڤ لەسەر ئوستووره و ئوستوورەکان دەبینرێ. لەبیرمان نەچێ زۆر لە ئوستووره و حەکایەتە ئایینییەکانیش ڕیشەی ئوستوورەییان هەیە[1] و زۆرێک لەم بنەمایانە لەرۆژهەڵاتی ناویندا هەن و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئوستوورەو جادووە هیندییەکان.

٣- شازادە: لە زۆربەی ئوستووره کوردییەکاندا شازادە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێ. شازادە یان تاقانەیە یان کوڕی خۆشەویستی باوکییەتی و بەم پێیە باوکی هەموو شت دەکات لەپێناو بەختەوەری ئەودا، لە مەم و زینی هەورامیدا ئەمە دیارە، کە شا مەم کوڕی پاشای یەمەنە

---

١- نامق هەورامی، هەورامی زمانی ئایینی یارسان، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی دەریا، سلێمانی ٢٠١٣.

دیشان کە شای مەم نشتەن و دەماغ
شوڵەی جەمینش چون شوڵەی چراغ
باڵاش چون عەرعەر ساوای زەڕستوون
گۆناش مەدرۆشۆ وێنەی لاڵەی کۆن
وستەن چەند فەرشان کار خۆراسان
موتەکا و باڵشت نە هەزار ڕەنگان
ئەساسێ بەی تەور ڕازان ڕێزیان
فەرشان وهەشت جە لاش بێزیان
غوڵامان جە لاش دەست و بان دەست
ئێقامەت کەردەن جە باڵا و پەست

٤- دێو یان پەری: لەزۆرێک لە ئوستوورەکاندا نەخشی دێو یان پەری بەرچاوە، هەر لەجادووکردنەوە تا دەتوەشاندن و گۆڕینی باروەدۆخێک ، لە مەم و زیندا گۆڕانی شێوەی نقێمی ئەنگوستیلەکەی مەم و لێکدانەوەکەی بەنگینە کە ئەمە کاری دێوە:

فیرۆزەی نگین ئەنگوشت دی ئەحمەر
سۆمەدا ونەش ئەخزەری ئەخزەر
ئەمیر وات بەنگین پڕ مێهر و تەمکین
پەی چێش سۆرخ بییەن فیرۆزەی نگین
داش نە رووی شۆعاع نەزەر کەرد مەنزوور
دەردەم شۆناساش حەککاکان دەستوور
سەجعەی نگینش کنیا بی بزین
خاتوون دنیا فردەوس بەرین

